

# ڕەوشی خوێندنەوەی کتێب

## لە هەرێمی کوردستان

### (پارێزگای سلێمانی بە نموونە)

دیاری ئەحمەد ئیسماعیل، ئیسماعیل ئیبراهیم
ئیدریس محەمەد،  هەژار حاتەم، یاسین محەمەد

## پێشەکی:

بێگومان خوێندنەوە ڕێگای پێشکەوتن و نیشانەی شارستانیبوونی کۆمەڵگاکانە، یەکێکە لەو لێهاتوویيانەی بەشداری پێکهاتنی ئەقڵی تاک دەکات و یارمەتی گەشەپێدان و فێربوونی دەدات، زانست و زانیارییە(المعرفة) بە خوێندنەوە فراوان دەبن و بەرەوپێش دەچن. تاکی خوێنەر لە کۆمەڵگەدا کەسایەتییەکی سوودبەخش و بەرهەمهێن و داهێنەرە. خوێندنەوە بنچینەی شیکردنەوە و ڕەخنەگرتن و دیالۆگی نێوان تاکەکانە و ڕێگایەکی سەرەکی گواستنەوەی ئەزموونی نەوەکانە بۆ یەکتری، هەروەها پردی پەیوەندیی و ئاڵوگۆڕی کلتووریی نێوان کۆمەڵگە و گەلە جیاوازەکانە.

بەڵام بەداخەوە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا سەرەڕای ئاسانبوونی ڕێگاکانی گەیاندن و چاپ و بڵاوکردنەوە، ئاستەنگ و لەمپەری زۆر لەبەردەم پرۆسەی خوێندنەوەدا دروستبوون، لەگەڵ زیادبوونی ژمارە و جۆر و شێوازەکانی پەخشکردن ئاڵنگارییەکانی بەردەم خوێندنەوە زۆرتر بوون و، زەین و بیری خوێنەر پەرشوبڵاو و ئاڵۆز بووە، جا ئەم ئاستەنگ و ئاڵنگارییانە هەرچیەک بن ئەنجامەکەی دوورکەوتنەوەیە لە خوێندنەوە. هەرێمی کوردستانیش لەم کەتوارەدا لە جیهان دابڕاو نییە و هەموو ئەو هەلومەرجانەی لە جیهاندا بوونەتە ڕێگر لەبەردەم خوێندنەوەدا هەرێمی کوردستانیشی پێدا تێپەڕ دەبێت.

بڵاوکردنەوەی کتێب و بوونی کتێبخانە و بەرزی ئاستی خوێندنەوە ئاماژەیەکی سەرەتاییە بۆ بەرزی ئاستی هۆشیاری. لەبەر ڕۆشنایی ئەو گرنگییە (سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی) وەک ناوەندێکی لێکۆڵینەوەی فیکریی و کارا لە بواری چاپ و بڵاوکردنەوەدا، توێژینەوەیەکی مەیدانی بۆ خستنەڕووی ڕەوشی خوێندنەوە لە هەرێمی کوردستان ئەنجامدا، لەمەشدا پارێزگای سلێمانی وەک کۆمەڵگەی توێژینەوە وەرگرتووە.

## ئامانجی توێژینەوە:

١. خستنەڕووی ڕەوشی خوێندنەوەی کتێب لە هەرێمی کوردستان و دەستنیشانکردنی ئەو بوارانەی کە زۆرترین خوێنەریان هەیە.

٢. دیاریکردنی ئەو بوارانەی کە زۆرترین خوێنەری هەیە لە ئەمڕۆدا لەناو خوێنەراندا.

٣. خستنەڕووی کاریگەریی و جیاوازی لەسەر خواستی کتێب بەپێی تەمەن، ڕەگەز و شوێنی نیشتەجێبوون.

### پرسیاری توێژینەوە:

لەبەر ڕۆشنایی ئامانجی توێژینەوە، توێژەران دەخوازن وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەنەوە:

١- لە هەرێمی کوردستان کتێبی چ بوارێک زۆرترین خوێنەری هەیە؟

٢- چ بوارێکی ئیسلامیی لەناو ئەو کتێبانەی لە ئێستادا بڵاودەبنەوە زۆرترین خوێنەری هەیە؟

٣- خوێنەر لەسەر چ بنەمایەک بڕیاردەدات کتێبێکی دیاریکراو بخوێنێتەوە؟

### کۆمەڵگەی توێژینەوە:

لەم توێژینەوە مەیدانییەدا، توێژەران تەواوی پارێزگای سلێمانی وەکو کۆمەڵگەی توێژینەوە دەستنیشان دەکەن، کە سەنتەری شار و قەزا و ناحیەکانیشی لەخۆدەگرێت کە کتێبخانە یان ناوەندی چاپ و بڵاوکردنەوەیان تێدایە.

### نموونەی توێژینەوە:

توێژەران لەناو کۆمەڵگەی توێژینەوە، نموونەیەکیان وەرگرت کە زیاترە لە (١٠٠٠) کەس تا نوێنەرایەتییەکی ڕاستەقینەی کۆمەڵگەی توێژینەوە بکەن.

### ئامرازی بەکارهاتوو:

بۆ ئەنجامدانی توێژینەوەکە، توێژەران فۆڕمی ڕاپرسییان وەکو ئامرازێک بەکارهێنا بۆ کۆکردنەوەی زانیاریی لە کۆمەڵگەی توێژینەوە. ئەمەش دوای ئامادەکردنی بەگوێرەی هەنگاوە زانستییەکانی ئامادەکردنی فۆڕمی ڕاپرسی بەشێوەی سەرەتایی و خستنەبەردەست لیژنەی شارەزایان کە لە (٥) کەس پێکهاتبوون[١]، ئەوان ڕاو سەرنجی خۆیان لەسەر شیاوی بڕگەکانی فۆڕمەکە خستەڕوو، دواجار فۆڕمەکە بەشێوەی کۆتایی[٢] ئامادەکرا و لەکاتی دیاریکراو بەسەر نموونەی توێژینەوە دابەشکرا. کردنەوەی پێشانگای کتێب لە سلێمانی دەرفەتێک بوو لەبەردەم توێژەران تا فۆڕمی ڕاپرسی بەسەر نموونەی کۆمەڵگەی توێژینەوە بڵاوبکەنەوە، بەو مەبەستە لە ڕۆژانی (١٨- ٢٨/ ١١/ ٢٠٢٠) لە ڕێگەی تیمێکەوە لەناو پێشانگای نێودەوڵەتی کتێب لە سلێمانی (١٠١٤) فۆڕم دابەشکرا بەسەر ئەو کەسانەی کە دانیشتووی سنووری کۆمەڵگەی توێژینەوەکەن و لەلایەن نموونەی کۆمەڵگەی توێژینەوە پڕکرایەوە.

دوای وەرگرتنەوەی فۆڕمەکە، زانیارییەکانی ناوی خرانە سەر کۆمپیوتەر و لە ڕێگەی بەرنامەی (SPSS) و ئامرازی ئاماری گونجاو داتاکان شیکرانەوە و ئەنجامەکان خرانەڕوو.

١. بڕوانە پاشکۆی ژمارە (١).

٢. بڕوانە پاشکۆی ژمارە (٢).

## خستنەڕوو و شیکاری ئەنجامەکان

لەو ژمارەیەی وەکو نموونەی توێژینەوە وەرگیراوە کە (١٠١٤) کەسن، (٦٢٠) کەس (٦١,١٪) لە ڕەگەزی نێر و (٣٩٤) کەس (٣٨,٩٪) لە ڕەگەزی مێ بوون، خشتەر ژمارە (١) پێکهاتەی نموونەی توێژینەوە بە گوێرەی ڕەگەز دەخاتەڕوو.

**خشتەی ژمارە (١) پێکهاتەی نموونەی توێژینەوە بە گوێرەی ڕەگەز:**

| | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| نێر | 620 | 61.1 |
| مێ | 394 | 38.9 |
| کۆی گشتی | 1014 | 100.0 |

سەبارەت بە پێکهاتەی تەمەن؛ نموونەی توێژینەوەکە بۆ چوار گرووپی تەمەن دابەشکراوە: کەمتر لە ١٨ ساڵ، ١٨- ٢٤ ساڵ، ٢٥- ٣٩ ساڵ، ٤٠ ساڵ بەرەوژوور. لە کۆی نموونەی توێژینەوە (١٣) کەس تەمەنی دەستنیشان نەکردبوو. گرووپی تەمەنی (١٨- ٢٤ ساڵ) زۆرترین ڕێژەی نموونەی کۆمەڵگەی توێژینەوەیە، بەدوای ئەویش گرووپی تەمەنی (٢٥- ٣٩ ساڵ)، خشتەی ژمارە (٢) پێکهاتەی نموونەی کۆمەڵگەی توێژینەوە بەپێی تەمەن ڕووندەکاتەوە.

**خشتەی ژمارە (٢) پێکهاتەی نموونەی توێژینەوە بەگوێرەی تەمەن:**

| تەمەن | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| کەمتر لە ١٨ ساڵ | 72 | 7.2 |
| ١٨- ٢٤ ساڵ | 431 | 43.1 |
| ٢٥- ٣٩ ساڵ | 301 | 30.1 |
| ٤٠ ساڵ و زیاتر | 197 | 19.7 |
| کۆی گشتی | 1014 | 100.0 |

سەبارەت بە پیشە؛ توێژەران (٧) پیشەی سەرەکییان دەستنیشان کرد، لە ئەنجامدا (٤) کەس لەسەر فۆرمەکە پیشەکەی دەستنیشان نەکردبوو. زۆرینەی نموونەی توێژینەوە لە خوێندکاران پێکهاتوون بەڕێژەی (٤١,١٪)، بەدوای ئەوانیشدا مامۆستایان پلەی دووەم و فەرمانبەرنیش پلەی سێیەم، خشتەی ژمارە (٣) پیشەی نموونەی توێژینەوە دەخاتەڕوو.

**خشتەی ژمارە (٣) پیشەی نموونەی توێژینەوە:**

| پیشە | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| فەرمانبەر | 118 | 11.7 |
| مامۆستا | 182 | 18.0 |
| کاری ئازاد | 101 | 10.0 |
| خوێندکار | 415 | 41.1 |
| پزیشک | 27 | 2.7 |
| ژنی ماڵ | 24 | 2.4 |
| خانەنشین | 6 | 0.6 |
| هی تر | 137 | 13.6 |
| کۆی گشتی | 1014 | 100.0 |

سەبارەت بە بڕوانامەی نموونەی توێژینەوەکە؛ لە کۆی گشتیی بەشداربووان (٤٥) کەس بڕوانامەکەی دەستنیشان نەکردبوو، هەڵگرانی بڕوانامەی بەکالۆریۆس بە ڕێژەی (٤٣,٩٪) لە پلەی یەکەمی نموونەی توێژینەوەکەن، بەدوای ئەوانیشدا هەڵگرانی بڕوانامەی ئامادەیی. هەڵگرانی بڕوانامەی زانستی شەرعیش کەمترین ڕێژەی نموونەی توێژینەوەکەن، خشتەی ژمارە (٤) بڕوانامەی نموونەی توێژینەوە دەخاتەڕوو.

**خشتەی ژمارە (٤) بڕوانامەی نموونەی توێژینەوە:**

| بڕوانامە | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| ئامادەیی | 312 | 32.2 |
| زانستی شەرعی | 18 | 1.9 |
| دبلۆم | 144 | 14.9 |
| بەکالۆریۆس | 425 | 43.9 |
| ماستەر | 49 | 5.1 |
| دکتۆرا | 21 | 2.2 |
| کۆی گشتی | 114 | 100.0 |

دەربارەی شوێنی نیشتەجێبوونی نموونەی توێژینەوە، (١٩) کەس شوێنی نیشتەجێبوونی دەستنیشان نەکردبوو، ئەوانی تر کە ژمارەیان (٩٩٥) کەس بوو: سەنتەری پارێزگا (٧٤٤) کەس (٧٤,٨٪) زۆرترین ڕێژەی بەشداربووان بوون، خشتەی ژمارە (٥) نموونەی توێژینەوە بەپێی شوێنی نیشتەجێبوون دەخاتەڕوو.

**خشتەی ژمارە (٥) شوێنی نیشتەجێبوونی نموونەی توێژینەوە.**

| شوێنی نیشتەجێبوون | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| سەنتەری پارێزگا | 744 | 74.8 |
| قەزا | 174 | 17.5 |
| ناحیە | 70 | 7.0 |
| گوند | 7 | 0.7 |
| کۆی گشتی | 1014 | 100.0 |

* پرسیاری یەکەمی توێژینەوە بریتی بوو لە: لە هەرێمی کوردستاندا کتێبی چ بوارێک زۆرترین خوێنەری هەیە؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە بە گشتیی و بەپێی گۆڕاوەکانی ڕەگەز، بڕوانامە و تەمەن ئەنجامەکان دەخەینەڕوو؛ کتێبی ئایینی بە ڕێژەی (١٨,٥٪) زۆرترین خوێنەری هەبوو لەناو نموونەی توێژینەوەکەدا؛ ڕەنگە ئەمەش چەند هۆکارێک ڕۆڵی تێیدا هەبێت، لەوانە: ئایین سەرچاوەی سەرکی مەعریفەیە و هانی شوێنکەوتووانی دەدات بۆ فێربوون و شارەزایی، خودی ئیسلامیش وەک ئایینێکی ئاسمانی گرنگی زۆری بە فێربوون و زانست و زانیاری داوە، هانی شوێنکەوتووانی داوە شارەزای ئایینەکەیان ببن و بە دوای زانستدا بگەڕێن، لەلایەکی تریشەوە بەئاوڕدانەوە لە مێژووی کورد دامەزراوە ئاینییەکانی حوجرە و مزگەوت بە درێژایی چەندین سەدە بنکەی فێربوون و بڵاوکردنەوەی زانست بوون، دەیان کەسایەتی لەو ناوەندە ئایینیانەوە پێگەیشتوون و خزمەتیان بە کایە جیاوازەکانی مەعریفە کردووە، بۆیە بەجۆرێک لە جۆرەکان ئەو پاشخانە کاریگەری هەیە لەسەر خوێندنەوەی زیاتری کتێبی ئایینی. هۆکارێکی تر ڕەنگە بگەڕێتەوە بۆ پڕکردنەوەی لایەنی ڕۆحیی و ئەو پێویستییەی مرۆڤ کە ئایین ڕۆڵێکی گەورە دەبینێت لە دابینکردنی پێویستی ڕۆحیی مرۆڤەکان و هاندانی بۆ بەها باڵاکان. هۆکارێکی تر ئەوەیە، ئایین بە ڕوونی و سادەیی وەڵامی پرسیارە وجودییەکان دەداتەوە بەشێوەیەکی دڵنیاکەرانە و عقڵانیی شوبهە و گومانەکان دەڕەوێنێتەوە.

دوای کتێبی ئایینی، کتێبی ئەدەبی بە (١٣,٥٪) لە پلەی دووەمدایە، بە بڕوای توێژەران ئەمەش دەرئەنجامی کۆمەڵێک هۆکارە؛ خوێندنەوەی کتێبی ئەدەبی ماندوبوونی کەمترە و هەموو تەمەنەکان بەڕێژەی جیاواز و بەپێی بابەت چێژ لە خوێندنەوەی وەردەگرن،

هاوکات تاڕادەیەک پێداویستی ڕۆحیی خوێنەر پڕدەکاتەوە و، بەگشتیش ناوەندەکانی چاپ و وەرگێڕەکان گرنگیان داوە بە وەرگێڕانی دەقە ئەدەبییە ناودار و بەناوبانگەکان و، لە کوردستان بە زمانی کوردی چاپ کراون و لە گۆڕەپانی ڕۆشنبیریدا برەویان پێدەدرێت.

بواری گەشەپێدانی مرۆیی لە پلەی سێیەمی خوێندنەوەدایە، ئەم بوارەش وێڕای نوێی لە بواری مەعریەفەدا، تاڕادەیەک پەیوەستە بە سەرکەوتن و گەشەی خود و بازاڕی کار، لەوانەیە ئەمەش هۆکار بێت کە بووبێتە مایەی سەرنج و گرنگیپێدانی خوێنەری کورد بەو بوارە. خشتەی ژمارە (٦) ڕێژەی خوێنەری هەر بوارێک دەردەخات.

**خشتەی ژمارە (٦) ڕێژەی خوێنەری بوارەکان:**

| بوار | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| ئەدەبی | 353 | 13.5% |
| ئایینی | 486 | 18.5% |
| مێژوویی | 276 | 10.5% |
| پەروەردەیی | 260 | 9.9% |
| گەشەپێدانی مرۆیی | 321 | 12.3% |
| فیکریی و فەلسەفی | 217 | 8.3% |
| سیاسیی و یاسایی | 120 | 4.6% |
| زانستیی | 279 | 10.6% |
| زمان | 201 | 7.7% |
| هی تر | 107 | 4.1% |
| کۆی گشتی | 2620 | 100.0% |

لە ناو ڕەگەزی نێردا زۆرترین بابەتی خوێندراو بابەتی سیاسیی و یاسایی بوو (٧٦,٧٪)، بەڵام لەناو ڕەگەزی مێ بابەتی پەروەردەیی (٥٦,٩٪) بوو. خشتەی ژمارە (٧) ڕێژەی خوێنەری بوارەکان بەگوێرەی گۆڕاوی ڕەگەز دەستنیشان دەکات.

**خشتەی ژمارە (٧) ڕێژەی خوێنەری بوارەکان بەپێی ڕەگەز:**

| بوار | ڕەگەز | | | |
|---|---|---|---|---|
| | نێر | | مێ | |
| | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
| ئەدەبی | 204 | 57.8% | 149 | 42.2% |
| ئایینی | 297 | 61.1% | 189 | 38.9% |
| مێژوویی | 201 | 72.8% | 75 | 27.2% |
| پەروەردەیی | 112 | 43.1% | 148 | 56.9% |
| گەشەپێدانی مرۆیی | 142 | 44.2% | 179 | 55.8% |
| فیکریی و فەلسەفی | 139 | 64.1% | 78 | 35.9% |
| سیاسیی و یاسایی | 92 | 76.7% | 28 | 23.3% |
| زانستیی | 169 | 60.6% | 110 | 39.4% |
| زمان | 91 | 45.3% | 110 | 54.7% |
| هی تر | 47 | 43.9% | 60 | 56.1% |
| کۆی گشتی | 1494 | 57.0% | 1126 | 43.0% |

بەپێی ئاستی تەمەن، بەوجۆرەی کە نموونەی توێژینەوە بۆ چوار ئاست دابەشکرا: گرووپی تەمەنی (٢٥- ٣٩ ساڵ) لە بواری سیاسیی و یاسایی بە ڕێژەی (٤٠,٨٪) و، بواری مێژوویی بە ڕێژەی (٣٥,١٪) لەپێش گرووپی تەمەنەکانی ترەوەن، بەڵام لە سەرجەم بوارەکانی تر گرووپی تەمەنی (١٨- ٢٤ ساڵ) زۆرترین خوێنەرن، بەڵام گرووپی تەمەنی (خوار ١٨ ساڵ) کەمترین ڕێژەیان تۆمارکردووە، خشتەی ژمارە(٨) ڕێژەی خوێنەری بوارەکان بەپێی گرووپی تەمەن دەخاتەڕوو.

**خشتەی ژماری (٨) ڕێژەی خوێنەری بوارەکان بەپێی تەمەن:**

| بوار | تەمەن | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | کەمتر لە ١٨ ساڵ | | 18- 24 ساڵ | | 25- 39 ساڵ | | ٤٠ ساڵ و زیاتر | |
| | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
| ئەدەبی | 27 | 7.8% | 151 | 43.4% | 99 | 28.4% | 71 | 20.4% |
| ئایینی | 35 | 7.3% | 200 | 41.5% | 144 | 29.9% | 103 | 21.4% |

| | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| مێژوویی | 12 | 4.3% | 88 | 31.9% | 97 | 35.1% | 79 | 28.6% |
| پەروەردەیی | 10 | 3.9% | 119 | 46.5% | 70 | 27.3% | 57 | 22.3% |
| گەشەپێدانی مرۆیی | 23 | 7.3% | 164 | 52.1% | 91 | 28.9% | 37 | 11.7% |
| فیکریی و | 12 | 5.6% | 108 | 50.7% | 61 | 28.6% | 32 | 15.0% |
| سیاسیی و یاسایی | 5 | 4.2% | 31 | 25.8% | 49 | 40.8% | 35 | 29.2% |
| زانستیی | 21 | 7.7% | 133 | 48.7% | 73 | 26.7% | 46 | 16.8% |
| زمان | 18 | 9.2% | 92 | 46.9% | 53 | 27.0% | 33 | 16.8% |
| هی تر | 9 | 8.6% | 58 | 55.2% | 22 | 21.0% | 16 | 15.2% |
| کۆی گشتی | 172 | 6.7% | 1144 | 44.3% | 759 | 29.4% | 509 | 19.7% |

سەبارەت بە گۆڕاوی بڕوانامە و کاریگەری لەسەر بواری خوێندنەوە:

- لەناو هەڵگرانی بڕوانامەی ئامادەیی (١٩,٧٪) بابەتی ئایینی دەخوێننەوە، (١٤,٩٪) بابەتی ئەدەبی و (١٢,٨٪) بابەتی گەشپێدانی مرۆیی دەخوێننەوە.
- هەڵگرانی بڕوانامەی زانستە شەرعییەکانن، (٣١,١٪) بابەتی ئایینی و (١١,١٪) بابەتی ئەدەبی، مێژوویی و گەشەپێدانی مرۆیی دەخوێننەوە.
- هەڵگرانی بڕوانامەی دبلۆم بە پلەی یەکەم (٢٠,١٪) بابەتی ئایینی و (١٣,٥٪) بابەتی پەروەردەیی و گەشەپێدانی مرۆیی و (١١,٥٪) بابەتی ئەدەبی دەخوێننەوە.
- هەڵگرانی بڕوانامەی بەکالۆریۆس بە پلەی یەکەم بابەتی ئایینی (١٦,٩٪) و پاشان بابەتی ئەدەبی (١٣,٤٪) و گەشەپێدانی مرۆیی (١٢,٤٪) دەخوێننەوە.
- بڕوانامەی ماستەریش بە پلەی یەکەم (١٥٪) بابەتی ئایینی، بابەتی مێژوویی بە ڕێژەی (١٢,٩٪)، بابەتی ئەدەبیش بە ڕێژەی (١١,٤٪) دەخوێننەوە.
- هەڵگرانی بڕوانەمەی دکتۆرا هەردوو بابەتی ئایینی و ئەدەبی بە ڕێژەی (١٥,٤٪) و بە ڕێژەی (١٣,٥٪) بابەتی مێژوویی و زانستی دەخوێننەوە.

بەگشتیش لای سەرجەم خاوەن بڕوانامەکان بابەتی  ئایینی لە پلەی یەکەمدایە، تەنها لای هەڵگرانی بڕوانامەی دکتۆرا بابەتی ئەدەبی بە هەمان ڕێژەی بابەتی ئایینی دەخوێندرێتەوە. خشتەی ژمارە (٩) ڕێژەی خوێندنەوەی بوارەکان بەپێی گۆڕاوی بڕوانامە ڕووندەکاتەوە.

**خشتەی ژمارە (٩) ڕێژەی خوێندنەوەی بوارەکان بەپێی گۆڕاوی بڕوانامە.**

| بوار | بڕوانامە | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | ئامادەیی | | زانستی شەرعی | | دبلۆم | | بەکالۆریۆس | | ماستەر | | دکتۆرا | |
| | ژمارە | % | ژمارە | % | ژمارە | % | ژمارە | % | ژمارە | % | ژمارە | % |
| ئەدەبی | 108 | 14.9% | 5 | 11.1% | 46 | 11.5% | 155 | 13.4% | 16 | 11.4% | 8 | 15.4% |
| ئایینی | 143 | 19.7% | 14 | 31.1% | 80 | 20.1% | 196 | 16.9% | 21 | 15.0% | 8 | 15.4% |
| مێژوویی | 58 | 8.0% | 5 | 11.1% | 40 | 10.0% | 128 | 11.1% | 18 | 12.9% | 7 | 13.5% |
| پەروەردەیی | 58 | 8.0% | 4 | 8.9% | 54 | 13.5% | 116 | 10.0% | 13 | 9.3% | 6 | 11.5% |
| گەشەپێدانی مرۆیی | 93 | 12.8% | 5 | 11.1% | 54 | 13.5% | 143 | 12.4% | 12 | 8.6% | 6 | 11.5% |
| فیکریی و فەلسەفی | 66 | 9.1% | 3 | 6.7% | 27 | 6.8% | 99 | 8.6% | 14 | 10.0% | 5 | 9.6% |
| سیاسیی و یاسایی | 26 | 3.6% | 2 | 4.4% | 19 | 4.8% | 52 | 4.5% | 15 | 10.7% | 1 | 1.9% |
| زانستیی | 76 | 10.5% | 4 | 8.9% | 38 | 9.5% | 134 | 11.6% | 11 | 7.9% | 7 | 13.5% |
| زمان | 60 | 8.3% | 1 | 2.2% | 29 | 7.3% | 90 | 7.8% | 14 | 10.0% | 2 | 3.8% |
| هی تر | 38 | 5.2% | 2 | 4.4% | 12 | 3.0% | 44 | 3.8% | 6 | 4.3% | 2 | 3.8% |
| کۆی گشتی | 726 | 100.0% | 45 | 100.0% | 399 | 100.0% | 1157 | 100.0% | 140 | 100.0% | 52 | 100.0% |

* پرسیاری دووەمی توێژینەوە بریتیی بوو لە: چ بوارێکی ئایینی لەناو ئەو کتێبانەی لە ئێستادا بڵاودەبنەوە زۆرترین خوێنەری هەیە؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارەش بەپێی گۆڕاوەکانی ڕەگەز، بڕوانامە، تەمەن و شوێنی نیشتەجێبوون شیکاری دەکەین. توێژەران لەناو بواری ئایینی، چەند بابەتێکیان دیاریکرد تا خوێنەر ئەو بابەتە دەستنیشانی بکات کە زۆرتر دەیخوێنێتەوە و داواش لە خوێنەر کرابوو دەتوانێت (١-٣) بژاردە دیاری بکات.

بەپێی گۆڕاوی ڕەگەز ئەنجامی وەڵامی پرسیارەکە دەریدەخات کە ڕەگەزی نێر بابەتی تەفسیر (٢٠,٣٪) زۆرترین خوێنەری هەبوو، بابەتی ئادابی گشتیش (٤,٥٪) کەمترین خوێنەری هەبوو، بەڵام لەناو ڕەگەزی مێ ژیاننامەی پێغەمبەر (١٩,٣٪) پلەی یەکەم و فەرمووده (١٧,٨٪) پلەی دووەم و تەفسیر (١٦,٧٪) لە پلەی سێیەمدا خوێنەری هەبوو. دەردەکەوێت جیاوازیی هەیە لەنێوان هەردوو ڕەگەز لە خوێندنەوەی بابەتە ئایینییەکاندا، خشتەی ژمارە (١٠) ڕێژەی خوێندنەوەی بابەتە ئایینییەکان بە پێی گۆڕاوی ڕەگەز دەخاتەڕوو.

**خشتەی ژمارە (١٠) ڕێژەی خوێندنەوەی بابەتە ئایینییەکان بەگوێرەی گۆڕاوی ڕەگەز:**

| کتێبی ئایینی | بوار | ڕەگەز | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | نێر | | مێ | |
| | | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
| | تەفسیر | 135 | 20.3% | 90 | 16.7% |
| | فەرموودە | 106 | 16.0% | 96 | 17.8% |
| | فیقهـ | 85 | 12.8% | 45 | 8.3% |
| | عیرفان | 55 | 8.3% | 49 | 9.1% |
| | ژیاننامەی پێغەمبەر | 100 | 15.1% | 104 | 19.3% |
| | شەریعەت | 54 | 8.1% | 48 | 8.9% |
| | ئادابی گشتیی | 30 | 4.5% | 44 | 8.2% |
| | عەقیدە | 66 | 9.9% | 33 | 6.1% |
| | هی تر | 33 | 5.0% | 30 | 5.6% |

بەگوێرەی گرووپی تەمەن، گرووپی تەمەنی (خوار ١٨ ساڵ) هەرسێ بابەتی تەفسیر، فەرموودە و ژیاننامەی پێغەمبەر بەڕێژەی (٢٠,٢٪) دەخوێننەوە، بەڵام کەمتر مەیلیان بە لای بابەتی عیرفاندایە، کە کەمترین ڕێژەیە (٣,٢٪). گرووپی تەمەن (١٨- ٢٤ ساڵ) بەڕێژەی (١٦,٨٪) هەردوو بابەتی تەفسیر و ژیاننامەی پێغەمبەر دەخوێننەوە، بەڕێژەی (١٦٪) بابەتی فەرموودە لە پلەی سێیەمدا دەخوێننەوە، بەڵام گرووپی تەمەنی (٢٥- ٣٩ ساڵ) بابەتی تەفسیر بەڕێژەی (١٨,٩٪) و هەردوو بابەتی فەرموودە و ژیاننامەی پێغەمبەر بەڕێژەی (١٦,٥٪) لە پلەی دووەمدا دەخوێننەوە، بەراورد بە تەمەنەکانی تر بابەتی فیقهی ئیسلامیی زۆرتر دەخوێننەوە بەڕێژەی (١٢,٣٪)، بەڵام گرووپی تەمەنی (٤٠ ساڵ بەرەوژوور) بەڕێژەی (٢٢,٥٪) بابەتی تەفسیر و بەڕێژەی (١٧,٩٪) بابەتی فەرموودە و بەڕێژەی (١٦,٧٪) ژیاننامەی پێغەمبەر دەخوێننەوە. وەک تێبینی دەکرێت لە هەموو تەمەنەکاندا بابەتەکانی تەفسیر، فەرموودە و ژیاننامەی پێغەمبەر ڕێژەی خوێندنەوەی لە بابەتەکانی تر زۆرترە. خشتەی ژمارە (١١) ڕێژەی خوێندنەوەی بابەتە ئایینییەکان بەگوێرەی گرووپی تەمەن ڕووندەکاتەوە.

**خشتەی ژمارە (١١) ڕێژەی خوێندنەوەی بابەتە ئاینییەکان بە گوێرەی تەمەن:**

| [illegible] ئایینی | بوار | تەمەن | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | کەمتر لە 18 ساڵ | | 18 -24 ساڵ | | 25 -39 ساڵ | | 40 ساڵ و زیاتر | |
| | | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
| | تەفسیر | 19 | 20.2% | 88 | 16.8% | 63 | 18.9% | 54 | 22.5% |
| | فەرموودە | 19 | 20.2% | 84 | 16.0% | 55 | 16.5% | 43 | 17.9% |
| | فیقهـ | 8 | 8.5% | 55 | 10.5% | 41 | 12.3% | 25 | 10.4% |
| | عیرفان | 3 | 3.2% | 53 | 10.1% | 29 | 8.7% | 17 | 7.1% |
| | ژیاننامەی پێغەمبەر | 19 | 20.2% | 88 | 16.8% | 55 | 16.5% | 40 | 16.7% |
| | شەریعەت | 6 | 6.4% | 48 | 9.1% | 31 | 9.3% | 16 | 6.7% |
| | ئادابی گشتیی | 5 | 5.3% | 35 | 6.7% | 18 | 5.4% | 14 | 5.8% |
| | عەقیدە | 10 | 10.6% | 45 | 8.6% | 26 | 7.8% | 18 | 7.5% |
| | هی تر | 5 | 5.3% | 29 | 5.5% | 16 | 4.8% | 13 | 5.4% |

بەپێی بڕوانامە: هەڵگرانی بڕوانامەی ئامادەیی بە پلەی یەکەم بابەتی فەرموودە (١٩,٥٪)دەخوێننەوە. بڕوانامەی زانستە شەرعییەکان: بابەتی تەفسیر (٢٩٪). بڕوانامەی دبلۆم: ژیاننامەی پێغەمبەر (٢٠,٦٪). بڕوانامەی بەکالۆریۆس: تەفسیر (١٨,٣٪). بڕوانامەی ماستەر: تەفسیر و فەرموودە (١٧,٣٪). بڕوانامەی دکتۆراش: تەفسیر (٢٤,٢٪)، بەراورد بەوانی تر خاوەن بڕوانامەی دکتۆرا گرنگی زیاتر بە بابەتی شەریعەت دەدەن. جێی تێبینیە کە لەناو نموونەی توێژینەوەکەدا هەڵگرانی بڕوانامەی زانستە شەرعییەکان هیچ بابەتی عیرفانی ئیسلامی ناخوێننەوە. خشتەی ژمارە (١٢) ڕێژەی خوێندنەوەی بابەتە ئیسلامییەکان بەگوێرەی بڕوانامە دەخاتەڕوو.

**خشتەی ژمارە (١٢) ڕێژەی خوێندنەوەی بابەتە ئیسلامییەکان بە گوێرەی بڕوانامە:**

| کتێبی ئایینی | | بڕوانامە | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | ئامادەیی | | زانستی شەرعی | | دبلوم | | بەکالۆریۆس | | ماستەر | | دکتۆرا | |
| | | ژمارە | % | ژمارە | % | ژمارە | % | ژمارە | % | ژمارە | % | ژمارە | % |
| | تەفسیر | 60 | 17.5% | 9 | 29.0% | 31 | 18.8% | 96 | 18.3% | 9 | 17.3% | 8 | 24.2% |
| | فەرموودە | 67 | 19.5% | 4 | 12.9% | 27 | 16.4% | 77 | 14.6% | 9 | 17.3% | 7 | 21.2% |
| | فیقھ | 34 | 9.9% | 8 | 25.8% | 15 | 9.1% | 56 | 10.6% | 8 | 15.4% | 3 | 9.1% |
| | عیرفان | 23 | 6.7% | 0 | 0.0% | 18 | 10.9% | 55 | 10.5% | 4 | 7.7% | 2 | 6.1% |
| | ژیاننامەی پێغەمبەر | 55 | 16.0% | 2 | 6.5% | 34 | 20.6% | 89 | 16.9% | 8 | 15.4% | 3 | 9.1% |
| | شەریعەت | 30 | 8.7% | 3 | 9.7% | 15 | 9.1% | 44 | 8.4% | 4 | 7.7% | 4 | 12.1% |
| | ئادابی گشتیی | 26 | 7.6% | 1 | 3.2% | 7 | 4.2% | 29 | 5.5% | 6 | 11.5% | 2 | 6.1% |
| | عەقیدە | 28 | 8.2% | 2 | 6.5% | 14 | 8.5% | 47 | 8.9% | 3 | 5.8% | 2 | 6.1% |
| | هی تر | 20 | 5.8% | 2 | 6.5% | 4 | 2.4% | 33 | 6.3% | 1 | 1.9% | 2 | 6.1% |
| | کۆی گشتی | 343 | 100.0% | 31 | 100.0% | 165 | 100.0% | 526 | 100.0% | 52 | 100.0% | 33 | 100.0% |

بەپێی شوێنی نیشتەجێبوون: دانیشتوانی سەنتەری پارێزگا بە پلەی یەکەم (١٩,٨٪) تەفسیر دەخوێننەوە، بەڵام دانیشتوانی قەزاکان ژیاننامەی پێغەمبەر (١٨,٦٪) دەخوێننەوە. دانیشتوانی ناحیەش بابەتی فەرموودە (٢٣,٣٪)، بەڵام گوندنشینان فەرموودە (٦٦,٧٪)، هەروەها هەردوو بابەتی عیرفان و شەریعەت بە ڕێژەی (١٦,٧٪) دەخوێننەوە، بەڕەچاوکردنی ئەوەی ژمارەی گوندنشین لە نموونەی کۆمەڵگەی توێژینەوەکەدا کەمترە لەوانی تر. خشتەی ژمارە (١٣) ڕێژەی خوێندنیوەی بابەتە ئیسلامییەکان بەگوێرەی شوێنی نیشتەجێبوون دەخاتەروو.

**خشتەی ژمارە (١٣) ڕێژەی خوێندنەوەی بابەتە ئیسلامییەکان بەگوێرەی شوێنی نیشتەجێبوون.**

| کتێبی ئایینی | بوار | نیشتەجێبوون | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | سەنتەری پارێزگا | | قەزا | | ناحیە | | گوند | |
| | | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
| | تەفسیر | 167 | 19.6% | 39 | 16.9% | 18 | 17.5% | 0 | 0.0% |
| | فەرموودە | 138 | 16.2% | 35 | 15.2% | 24 | 23.3% | 4 | 66.7% |
| | فیقھ | 85 | 10.0% | 36 | 15.6% | 8 | 7.8% | 0 | 0.0% |
| | عیرفان | 73 | 8.5% | 20 | 8.7% | 10 | 9.7% | 1 | 16.7% |
| | ژیاننامەی پێغەمبەر | 144 | 16.9% | 43 | 18.6% | 16 | 15.5% | 0 | 0.0% |
| | شەریعەت | 77 | 9.0% | 15 | 6.5% | 7 | 6.8% | 1 | 16.7% |
| | ئادابی گشتیی | 55 | 6.4% | 13 | 5.6% | 4 | 3.9% | 0 | 0.0% |
| | عەقیدە | 63 | 7.4% | 25 | 10.8% | 10 | 9.7% | 0 | 0.0% |
| | هی تر | 52 | 6.1% | 5 | 2.2% | 6 | 5.8% | 0 | 0.0% |
| | کۆی گشتی | 854 | 100.0% | 231 | 100.0% | 103 | 100.0% | 6 | 100.0% |

بەسەرنجدان لە خشتەکانی (١٠، ١١، ١٢، ١٣) ڕووندەبێتەوە بابەتەکانی تەفسیر، فەرموودە و ژیاننامەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت)، بەبوونی جیاوازییەکی کەم لە نێوانیان بەپێی گۆڕاوەکانی توێژینەوە، لەناو بابەتە ئایینیەکاندا خوێنەری زۆرترە؛ بە بڕوای توێژەران ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ: میحوەربوونی قورئان، فەرموودە و ژیاننامەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت) لەسەر هزری تاکی مسوڵمان و کاریگەری گەورەی ئەو بوارانە لە دروستبوون و قەتماغەبەستنی دونیابینیی، هەروەها بۆ تێگەیشتن لە ئایەتەکانی قورئان و لێکدانەوەی چەمک و زاراوەکان پەنا دەبرێتە بەر تەفسیر و فەرەموودە، پێشتریش بە زمانی کوردی کتێبی تەفسیر و فەرموودە کەمتر بوو، بەڵام لە ئێستادا بەشێوەیەکی بەرچاو گرنگی پێدەدرێت و برەوی هەیە و بەشێوازی جۆراو جۆر، کورتە، پوختە، و ... تاد تەفسیری کوردی هەیە و بەردەستی خوێنەرە.

پرسیاری سێیەم: خوێنەر لەسەر چ بنەمایەک بڕیاردەدات کتێبێکی دیاریکراو بخوێنێتەوە؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارەش توێژەران (١٠) برگەیان دیاریکردبوو کە خوێنەر دەیتوانی (١-٥) بژاردە دیاری بکات. بەگشتی خوێنەران بەم ڕیزبەندە پێنج بنەما یان پاڵنەری سەرەکییان بۆ خوێندنەوەی کتێبێکی دیاریکراو دەستنیشان کردووە: برگەی (حەز و خولیای خۆم بۆ بابەتێکی دیاریکراو): (٣٠,٢٪)، برگەی (حەزی خۆم بۆ گەشەپێدانی مەعریفە): (١٦,٧٪)، برگەی (ناوبانگی نووسەر یان وەرگێڕ): (١٣,٦٪)، برگەی (ناونیشانی کتێب): (٩,٩٪)، برگەی (گونجاوی لەگەڵ ئایدۆلۆجیا و دونیابینیم): (٩,٧٪)، کە دەکرێت بەگشتی ئەوانە وەک پێنج دیارترین پاڵنەری خوێندنەوەی کتێبێکی دیاریکراو دابنێین. خشتەی ژمارە (١٤) بنەماکانی بڕیاردانی خوێندنەوەی کتێبێکی دیاریکراو دەخاتەڕوو.

**خشتەی ژمارە (١٤) بنەماکانی بڕیاردانی خوێندنەوەی کتێبێکی دیاریکراو.**

| بڕیاری خوێندنەوە | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| ناوبانگی نووسەر یان وەرگێڕ | 349 | 13.6% |
| حەز و خولیای خۆم بۆ بابەتێکی دیاریکراو | 772 | 30.2% |
| پێویستیم بە کتێبەکە بۆ توێژینەوە و ڕاپۆرت | 206 | 8.1% |
| کتێبەکە مەنهەجیە و سەرچاوەیەکی خوێندنە | 136 | 5.3% |
| وەسفی خاوەن کتێبخانە بۆ کتێبەکە | 47 | 1.8% |
| ڕیکلامی دەزگاکانی ڕاگەیاندن و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان | 65 | 2.5% |
| گونجاوی لەگەڵ ئایدۆلۆجیا و دونیابینیم | 249 | 9.7% |
| چاولێکەری لە دۆست و هاوڕێ | 54 | 2.1% |
| حەزی خۆم بۆ گەشەپێدانی مەعریفە | 426 | 16.7% |
| ناونیشانی کتێب | 253 | 9.9% |
| کۆی گشتی | 2557 | 100.0% |

بەسەرنجدان لە خشتەی ژمارە (١٤) ڕووندەبێتەوە حەز و خولیای خودی خوێنەر بۆ بابەتێکی دیاریکراو و گەشەپێدانی مەعریفە، بەلای نموونەی کۆمەڵگەی توێژینەوەوە لە پلەیەکی بەرزدایە، وەکو پاڵنەرێکی بڕیاردان بۆ خوێندنەوەی کتێبێکی دیاریکراو، ئەمەش ئاماژەیەکی ئەرێنییە بۆ بەرزبوونەوەی ئاستی هۆشیاری خوێنەری کورد، کە گرنگی بە حەز و خولیای خۆی بدات لە بوارێکی دیاریکراودا. هەروەک دەردەکەوێت نووسەری ناودار و بە ئەزموون کاریگەری هەیە لەسەر دیاریکردنی بوارێکی خوێندنەوە و کتێبی خوێندراوە، بەڵام ئەوەی جێگەی تێبینیە، ڕێکلامکردن بۆ کتێب کەمترین کاریگەری کردووەتە سەر خوێنەرانی نموونەی کۆمەڵگەی توێژینەوە، ڕەنگە ئەمە بە پلەی یەکەم بگەڕێتەوە بۆ بەرزی ئاستی هۆشیاری خوێنەر، پاشانیش بەگشتیی ڕێکلام لە بوارەکانی تر لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە زۆرجار بەشێوەی نەرێنیی نمایش دەکرێت و ئەمەش جۆرێک لە جۆرەکان کاریگەری کردووەتە سەر کەمبایەخبوونی ڕێکلامی کتێب، هەروەک دەردەکەوێت لەگەڵ بەرەوپێشچوونی تەمەن کاریگەری ڕێکلام کەمتر بووەتەوە.

بەلای ڕەگەزی نێر برگەی (حەز و خولیای خۆم بۆ بابەتێکی دیاریکراو) بەڕێژەی (٣١,٥٪) پاڵنەری سەرەکییە بۆ بڕیاردان لەسەر خوێندنەوەی کتێبێکی دیاریکراو، هەمان برگە لای ڕەگەزی مێ ڕێژەی (٢٨,٥٪)ی هەیە. خشتەی ژمارە (١٥) بنەماکانی بڕیاردان لە خوێندنەوەی کتێبێکی دیاریکراو بەگوێرەی گۆڕاوی ڕەگەز دەخاتەڕوو.

**خشتەی ژمارە (١٥) بنەماکانی بڕیاردان لە خوێندنەوەی کتێبێکی دیاریکراو بەگوێرەی گۆڕاوی ڕەگەز**

| بڕیاری خوێندنەوە | ڕەگەز | | | |
|---|---|---|---|---|
| | نێر | | مێ | |
| | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
| ناوبانگی نووسەر یان وەرگێڕ | 215 | 14.8% | 134 | 12.2% |
| حەز و خولیای خۆم بۆ بابەتیکی دیاریکراو | 459 | 31.5% | 313 | 28.5% |
| پێویستیم بە کتێبەکە بۆ توێژینەوە و ڕاپۆرت | 130 | 8.9% | 76 | 6.9% |
| کتێبەکە مەنهەجیە و سەرچاوەیەکی خوێندنە | 85 | 5.8% | 51 | 4.6% |
| وەسفی خاوەن کتێبخانە بۆ کتێبەکە | 25 | 1.7% | 22 | 2.0% |
| ڕێکلامی دەزگاکانی ڕاگەیاندن و تۆڕە کۆمەلایەتییەکان | 29 | 2.0% | 36 | 3.3% |
| گونجاوی لەگەڵ ئایدۆلۆجیا و دونیابینیم | 144 | 9.9% | 105 | 9.5% |
| چاولیکەری لە دۆست و هاوڕی | 25 | 1.7% | 29 | 2.6% |
| حەزی خۆم بۆ گەشەپێدانی مەعریفە | 218 | 15.0% | 208 | 18.9% |
| ناونیشانی کتێب | 127 | 8.7% | 126 | 11.5% |
| کۆی گشتی | 1457 | 100.0% | 1100 | 100.0% |

بەگوێرەی گرووپی تەمەن: بڕگەی (حەز و خولیای خۆم بۆ بابەتێکی دیاریکراو) بەڕێژەی جیاواز لای هەر چوار گرووپە تەمەن جیاوازەکان لە پلەی یەکەمدایە، بڕگەی (حەزی خۆم بۆ گەشەپێدانی مەعریفە) بە هەمان شێوە بە جیاوازی ڕێژە لای هەموو گرووپەکان لە پلەی دووەمدایە، بڕگەی (ناوبانگی نووسەر یان وەرگێڕ) لای هەموو گرووپەکان لە پلەی سێیەمدایە، بەڵام لە بڕگەکانی تر جیاوازی لە نێوان گرووپە تەمەن جیاوازەکان هەیە. خشتەی ژمارە (١٦) بنەماکانی بڕیاردان لە خوێندنەوەی کتێبێکی دیاریکراو بەگوێرەی تەمەن دەخاتەڕوو.

**خشتەی ژمارە (١٦) بنەماکانی بڕیاردان لە خوێندنەوەی کتێبێکی دیاریکراو بەگوێرەی گۆڕاوی ڕەگەز:**

| بڕیاری خوێندنەوە | تەمەن | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | کەمتر لە ١٨ ساڵ | | 18 - 24 ساڵ | | 25 - 39 ساڵ | | ٤٠ ساڵ و زیاتر | |
| | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
| ناوبانگی نووسەر یان وەرگێڕ | 24 | 14.5% | 147 | 13.2% | 105 | 13.8% | 69 | 14.3% |
| حەز و خولیای خۆم بۆ بابەتێکی دیاریکراو | 49 | 29.7% | 336 | 30.2% | 223 | 29.3% | 156 | 32.4% |
| پێویستیم بە کتێبەکە بۆ توێژینەوە و ڕاپۆرت | 8 | 4.8% | 73 | 6.6% | 68 | 8.9% | 55 | 11.4% |
| کتێبەکە مەنهەجیە و سەرچاوەیەکی خوێندنە | 9 | 5.5% | 63 | 5.7% | 41 | 5.4% | 23 | 4.8% |
| وەسفی خاوەن کتێبخانە بۆ کتێبەکە | 4 | 2.4% | 24 | 2.2% | 7 | .9% | 9 | 1.9% |
| ڕیکلامی دەزگاکانی ڕاگەیاندن و تۆرە کۆمەڵایەتییەکان | 6 | 3.6% | 29 | 2.6% | 23 | 3.0% | 5 | 1.0% |
| گونجاوی لەگەڵ ئایدۆلۆجیا و دونیابینیم | 11 | 6.7% | 111 | 10.0% | 83 | 10.9% | 41 | 8.5% |
| چاولێکەری لە دۆست و هاوڕێ | 8 | 4.8% | 26 | 2.3% | 13 | 1.7% | 6 | 1.2% |
| حەزی خۆم بۆ گەشەپێدانی مەعریفە | 25 | 15.2% | 184 | 16.5% | 133 | 17.5% | 76 | 15.8% |
| ناونیشانی کتێب | 21 | 12.7% | 120 | 10.8% | 66 | 8.7% | 41 | 8.5% |
| کۆی گشتی | 165 | 100.0% | 1113 | 100.0% | 762 | 100.0% | 481 | 100.0% |

بەپێی گۆڕاوی بڕوانامە: بڕگەی (حەز و خولیای خۆم بۆ بابەتێکی دیاریکراو) لای هەموو هەڵگرانی بڕوانامەکان بەڕێژەی جیاواز لە پلەی یەکەمدایە، بڕگەی (حەزی خۆم بۆ گەشەپێدانی مەعریفە) لای هەڵگرانی بڕوانامەی ئامادەیی، دبلۆم، بەکالۆریۆس و زانستی شەرعی لە پلەی دووەمدایە. بە ڕەچاوکردنی ئەوەی بڕگەی (ناوبانگی نووسەر یان وەرگێڕ) لای هەڵگرانی زانستە شەرعییەکان بەڕێژەی (١٥,٩٪) لە هەمان پلەدایە لەپاڵ بڕگەی پێشوو، بەڵام لای هەڵگرانی بڕوانامەی ماستەر و دکتۆرا بڕگەی (پێویستیم بە کتێبەکە بۆ توێژینەوە و ڕاپۆرت) لە پلەی دووەمدایە. بڕگەی (ناوبانگی نووسەر یان وەرگێڕ) لای هەڵگرانی بڕوانامەی ئامادەیی، دبلۆم، بەکالۆریۆس و ماستەر لە پلەی سێیەمدایە، بەڵام لای هەڵگرانی بڕوانامەی زانستی شەرعی بڕگەی (پێویستیم بە کتێبەکە

بۆ توێژینەوە و ڕاپۆرت) لە پلەی سێیەمدایە. لای هەڵگرانی بڕوانامەی دکتۆراش بڕگەی (حەزی خۆم بۆ گەشەپێدانی مەعریفە) لە پلەی سێیەمدایە. خشتەی ژمارە (١٧) بنەماکانی بڕیاردان لە خوێندنەوەی کتێبێکی دیاریکراو بەگوێرەی گۆڕاوی بڕوانامە دەخاتەڕوو.

**خشتەی ژمارە (١٧) بنەماکانی بڕیاردان لە خوێندنەوەی کتێبێکی دیاریکراو بەگوێرەی بڕوانامە:**

| بڕیاری خوێندنەوە | بڕوانامە | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | ئامادەیی | | زانستی شەرعی | | دبلوم | | بەکالوریوس | | ماستەر | | دکتورا | |
| | ژمارە | % | ژمارە | % | ژمارە | % | ژمارە | % | ژمارە | % | ژمارە | % |
| ناوبانگی نووسەر یان وەرگێر | 91 | 13.0% | 7 | 15.9% | 53 | 14.3% | 153 | 13.5% | 24 | 15.8% | 8 | 10.7% |
| حەز و خولیای خوم بو بابەتیکی دیاریکراو | 237 | 33.8% | 13 | 29.5% | 104 | 28.1% | 334 | 29.4% | 38 | 25.0% | 18 | 24.0% |
| پێویستیم بە کتێبەکە بو توێژینەوە و راپورت | 46 | 6.6% | 6 | 13.6% | 15 | 4.1% | 90 | 7.9% | 32 | 21.1% | 15 | 20.0% |
| کتێبەکە مەنهەجیە و سەرچاوەیەکی خوێندنە | 36 | 5.1% | 3 | 6.8% | 15 | 4.1% | 56 | 4.9% | 14 | 9.2% | 7 | 9.3% |
| وەسفی خاوەن کتێبخانە بو کتێبەکە | 16 | 2.3% | 1 | 2.3% | 8 | 2.2% | 16 | 1.4% | 2 | 1.3% | 2 | 2.7% |
| ریکلامی دەزگاکانی راگەیاندن و تورە کومەلایەتییەکان | 18 | 2.6% | 1 | 2.3% | 13 | 3.5% | 29 | 2.6% | 1 | .7% | 1 | 1.3% |
| گونجاوی لەگەل ئایدولوجیا و دونیابینیم | 58 | 8.3% | 2 | 4.5% | 41 | 11.1% | 125 | 11.0% | 12 | 7.9% | 7 | 9.3% |
| چاولیکەری لە دوست و هاوری | 19 | 2.7% | 2 | 4.5% | 6 | 1.6% | 21 | 1.9% | 1 | .7% | 1 | 1.3% |
| حەزی خوم بو گەشەپیدانی مەعریفە | 112 | 16.0% | 7 | 15.9% | 68 | 18.4% | 200 | 17.6% | 18 | 11.8% | 11 | 14.7% |
| ناونیشانی کتێب | 69 | 9.8% | 2 | 4.5% | 47 | 12.7% | 111 | 9.8% | 10 | 6.6% | 5 | 6.7% |
| کوی گشتی | 702 | 100.0% | 44 | 100.0% | 370 | 100.0% | 1135 | 100.0% | 152 | 100.0% | 75 | 100.0% |

بەپێی گۆڕاوی کتێبی کوردی و وەرگێڕدراو: ڕەگەزی نێر بەڕێژەی (٥٩,٨٪) و ڕەگەزی مێ ڕێژەی (٦٩,٢٪) کتێبی وەرگێڕدراو بۆ کوردی دەخوێننەوە. تەمەنی (خوار ١٨ ساڵ) بەڕێژەی (٧٣,٥٪) کتێبی وەرگێڕدراو بۆ کوردی دەخوێننەوە. تەمەنی (٤٠ ساڵ بەرەوژوور) بەڕێژەی (٥٢,١٪) کتێبی دانراو بە کوردی دەخوێننەوە، بەمەش دەردەکەوێت لەگەڵ هەڵکشانی تەمەن خواستی خوێندنەوەی کتێبی دانراو بە کوردی زیاترە. سەرجەم خاوەن بڕوانامەکان بە پلەی یەکەم و بەڕێژەی جیاواز کتێبی وەرگێڕدراو بۆ کوردی دەخوێننەوە، خشتەی ژمارە (١٨) ڕێژەی خوێندنەوەی کتێبی دانراو بە کوردی و وەرگێڕدراو ڕووندەکاتەوە.

**خشتەی ژمارە (١٨) ڕێژەی خوێندنەوەی کتێبی دانراو بە کوردی و وەرگێڕدراو:**

| | | جۆری خوێندنەوە | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | دانراو بە کوردی | | وەرگێڕدراو بۆ کوردی | | |
| | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی | |
| ڕەگەز | نێر | 244 | 40.2% | 363 | 59.8% |
| | مێ | 119 | 30.8% | 267 | 69.2% |
| تەمەن | کەمتر لە 18 ساڵ | 18 | 26.5% | 50 | 73.5% |
| | 18- 24 ساڵ | 137 | 32.5% | 285 | 67.5% |
| | 25- 39 ساڵ | 104 | 34.9% | 194 | 65.1% |
| | 40 ساڵ و زیاتر | 100 | 52.1% | 92 | 47.9% |
| بڕوانامە | ئامادەیی | 118 | 38.4% | 189 | 61.6% |
| | زانستی شەرعی | 8 | 44.4% | 10 | 55.6% |
| | دبلۆم | 44 | 31.2% | 97 | 68.8% |
| | بەکالۆریۆس | 142 | 34.0% | 276 | 66.0% |
| | ماستەر | 17 | 36.2% | 30 | 63.8% |
| | دکتۆرا | 8 | 44.4% | 10 | 55.6% |

سەبارەت بە هۆکاری خوێندنەوەی کتێبی وەرگێڕدراو بۆ کوردی، بەلای هەردوو ڕەگەزەوە بڕگەی (نووسەرانی بیانی ئەزموونی نووسینیان زیاترە) لە پلەی یەکەم و بڕگەی (نووسەرانی بیانی بەشێوەیەکی زانستی تر دەنووسن) لە پلەی دووەمدایە وەکو هۆکاری پاڵنەر بۆ خوێندنەوەی کتێبی وەرگێڕدراو بۆ کوردی. خشتەی ژمارە (١٩) هۆکارەکانی خوێندنەوەی کێبی وەرگێڕدراو بۆ کوردی بەپێی گۆڕاوی ڕەگەز دەخاتەڕوو.

**خشتەی ژمارە (١٩) هۆکارەکانی خوێندنەوەی کتێبی وەرگێڕدراو بۆ کوردی بەپێی گۆڕاوی ڕەگەز:**

| | | ڕەگەز | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | نێر | | مێ | |
| | | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
| خوێندنەوەی وەرگێڕدراو بۆ کوردی | نووسەرانی بیانی ئەزموونی نووسینیان زیاترە | 220 | 46.7% | 132 | 40.4% |
| | نووسەرانی بیانی بەشێوەیەکی زانستی تر دەنووسن | 114 | 24.2% | 70 | 21.4% |
| | کەمی پسپۆری نووسەری کورد | 89 | 18.9% | 64 | 19.6% |
| | ناسراوی نووسەرانی بیانی | 48 | 10.2% | 61 | 18.7% |
| | کۆی گشتی | 471 | 100.0% | 327 | 100.0% |

بەپێی گۆڕاوی بڕوانامەش: بەلای هەموو خاوەن بڕوانەمەکانە بڕگەی (نووسەرانی بیانی ئەزمونی نووسینیان زیاترە) لە پلەی یەکەمدایە وەکو هۆکاری پاڵنەر بۆ خوێندنەوەی کتێبی وەرگێڕدراو بۆ کوردی. خشتەی ژمارە (٢٠) هۆکارەکانی خوێندنەوەی کێبی وەرگێڕدراو بۆ کوردی بەپێی گۆڕاوی بڕوانامە دەخاتەڕوو.

**خشتەی ژمارە (٢٠) هۆکارەکانی خوێندنەوەی کتێبی وەرگێڕدراو بۆ کوردی بەپێی گۆڕاوی بڕوانامە:**

| | | بڕوانامە | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | ئامادەیی | | زانستی شەرعی | | دبلۆم | | بەکالۆریۆس | | ماستەر | | دکتۆرا | |
| | | ژ | % | ژ | % | ژ | % | ژ | % | ژ | % | ژ | % |
| خوێندنەوەی وەرگێڕدراو بۆ کوردی | نووسەرانی بیانی ئەزموونی نووسینیان زیاترە | 110 | 46.2% | 6 | 40.0% | 48 | 43.2% | 157 | 43.7% | 17 | 44.7% | 7 | 46.7% |
| | نووسەرانی بیانی بەشێوەیەکی زانستی تر دەنووسن | 51 | 21.4% | 4 | 26.7% | 25 | 22.5% | 83 | 23.1% | 10 | 26.3% | 3 | 20.0% |
| | کەمی پسپۆری نووسەری کورد | 35 | 14.7% | 2 | 13.3% | 26 | 23.4% | 76 | 21.2% | 8 | 21.1% | 4 | 26.7% |
| | ناسراوی نووسەرانی بیانی | 42 | 17.6% | 3 | 20.0% | 12 | 10.8% | 43 | 12.0% | 3 | 7.9% | 1 | 6.7% |
| | کۆی گشتی | 238 | 100.0% | 15 | 100.0% | 111 | 100.0% | 359 | 100.0% | 38 | 100.0% | 15 | 100.0% |

ڕەگەزی نێر بەڕێژەی (٪٨٩,٧) و ڕەگەزی مێ بەڕێژەی (٪٩٣,٦) خوێندنەوە لەسەر چاپکراوی سەر کاغەز پەسەند دەکەن. هەروەک بەپێی گرووپی تەمەن و بڕوانامە و شوێنی نیشتەجێبوونیش، هەمووان خوێندنەوە لەسەر چاپکراوی سەر کاغەز پەسەند دەکەن بەڕێژەی جیاواز. خشتەی ژمارە (٢١) ڕێژەی پەسەندکردنی خوێندنەوەی چاپکراوی سەر کاغەز و ئامێرە ئەلکترۆنییەکان دەخاتەڕوو.

**خشتەی ژمارە (٢١) ڕێژەی پەسەندکردنی خوێندنەوەی چاپکراوی سەر کاغەز و ئامێرە ئەلکترۆنییەکان:**

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | خوێندنەوەی چاپکراوی | | | |
| | سەر کاغەز | | ئامێرە ئەلکترۆنییەکان | | |
| | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی | |
| ڕەگەز | نێر | 556 | 89.7% | 64 | 10.3% |
| | مێ | 366 | 93.6% | 25 | 6.4% |
| تەمەن | کەمتر لە 18 ساڵ | 65 | 90.3% | 7 | 9.7% |
| | 18- 24 ساڵ | 389 | 90.7% | 40 | 9.3% |
| | 25- 39 ساڵ | 274 | 91.3% | 26 | 8.7% |
| | 40 ساڵ و زیاتر | 183 | 92.9% | 14 | 7.1% |
| بڕوانامە | ئامادەیی | 280 | 89.7% | 32 | 10.3% |
| | زانستی شەرعی | 17 | 94.4% | 1 | 5.6% |
| | دبلۆم | 136 | 95.1% | 7 | 4.9% |
| | بەکالۆریۆس | 382 | 90.3% | 41 | 9.7% |
| | ماستەر | 46 | 93.9% | 3 | 6.1% |
| | دکتۆرا | 21 | 100.0% | 0 | 0.0% |
| نیشتەجێبوون | سەنتەری پارێزگا | 676 | 91.0% | 67 | 9.0% |
| | قەزا | 160 | 92.5% | 13 | 7.5% |
| | ناحیە | 65 | 94.2% | 4 | 5.8% |
| | گوند | 4 | 57.1% | 3 | 42.9% |

سەبارەت بە کاتی تەرخانکراو بۆ خوێندنەوە لە شەو و ڕۆژێکدا: (٤٧٪) بەشداربووان (١) کاتژمێر دەخوێننەوە، (٣٪) بەشداربووان (٦) کاتژمێر و بەرەوژوور دەخوێننەوە. خشتەی ژمارە (٢٢) کاتژمێری تەرخانکراو بۆ خوێندنەوە لە ماوەی شەو و ڕۆژێکدا دەخاتەڕوو.

**خشتەی ژمارە (٢٢) کاتژمێرەکانی خوێندنەوە لە ماوەی شەو و ڕۆژێکدا:**

| کاتژمێری تەرخانکراو | ڕێژەی سەدی |
|---|---|
| 1 | 47 |
| 2 | 34 |
| 5-3 | 16 |
| 6 بەرەوژوو | 3 |
| کۆی گشتیی | 100 |

## دەرئەنجام

توێژەران لەم توێژینەوە مەیدانییەدا بە چەندین ئەنجام گەیشتوون، لەوانە:

١. کتێبی ئایینی لە هەرێمی کوردستاندا لە هەموو بوارەکانی تر خوێنەری زیاترە.

٢. بابەتەکانی تەفسیر، فەرمووده و ژیاننامەی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێت)، بە بوونی جیاوازییەکی کەم لە نێوانیاندا، بەپێی گۆڕاوەکانی توێژینەوە، لەناو بابەتە ئایینیەکان خوێنەری زۆرترە لە بابەتەکانی تر.

٣. حەز و خولیای خودی خوێنەر بۆ بابەتێکی دیاریکراو و گەشەپێدانی مەعریفە، بەهێزترین پاڵنەرە لە بڕیاردان بۆ خوێندنەوەی کتێبێکی دیاریکراو .

٤. خوێنەری مێینە لە هەموو بوارەکاندا کەمترن لە خوێنەری نێرینە، لەوانەیە گرنگترین هۆکار بریتی بێت لە بوونی ئەرکی زیاتری ئافرەتان لە کاتە زێڕینەکانی خوێندنەوەدا.

٥. خوێنەرانی خوار (١٨ ساڵ) کەمترین ڕێژەن لەنێو خوێنەراندا، ئەوە دەردەخات کە خێزان و کەرتە پەروەردەییەکان کەمترین کاریان لەسەر بەهێزکردنی ئەم لایەنە کردووە لەسەر خوێندکاران.

٦. زۆرترین ڕێژەی خوێنەران لەناو چینی خاوەن بڕوانامە بەرزەکاندایە، کە لەگەڵ ئەوەی دیاردەیەکی ئاساییە، ئەوەش دەردەخات کە خوێندنەوە لە کوردستاندا بەزۆری کارێکی نوخبەوییە و نەبووەتە کولتوور کە هەموو چینەکانی کۆمەڵگە بگرێتەوە.

٧. ڕەوشی خوێندنەوە لە دەرەوەی سەنتەری شارەکاندا بە بەراورد لەگەڵ ئاستی ڕۆشنبیری و خوێندەواریاندا لە ئاستێکی باشدایە، کە نیشاندەرێکی ئەرێنییە.

٨. زۆرینەی بەشداربووانی توێژینەوە بەلایانەوە خوێندنەوەی چاپکراوی سەر کاغەز پەسەندترە لە خوێندنەوەی سەر ئامێرە ئەلیکترۆنییەکان.